بەشێک لە کتێبی :

# كِتَابُ الزُّهْدِ

لِلإِمَامِ الحَافِظِ شَيخِ المُحَدِّثِينَ أَبِي حَاتِمٍ مُحَمَّدِ بنِ إِدرِيسَ الحَنظَلِي الرَّازِيِّ

( ولد سنة ١٩٥ وتوفي سنة ٢٧٧ هـ رحمه الله تعالى )



همام الأثري

١٤٤٤ هـ

١ - **عائشة** رضي الله عنها ئەفەرموویێت :

ئێوە بێئاگان، باشترین عیبادەت خۆبەکەمزانین ـە .

٢ - **أبي بكر بن حفص** ئەفەرموویێت :

إبن فسحم لە ڕۆژی بدر ـدا کۆمەڵە خورمایەکی بەدەستەوە بوو، فڕێیدان و فەرمووی : ئەمە لەگەڵ دنیادایە، پاشان ڕۆشتە پێش - بۆ جیهاد کردن - شەڕی کرد هەتا کوژرا .

٣ - **مجاهد بن جبر** ئەڵێت :

عیسی علیه السلام لە بەری درەختی ئەخوارد، یەک جلی لەبەر ئەکرد، ئەو شوێنە ماڵی بوو کە شەو لێی ئەمایەوە، هیچی هەڵنەئەگرت بۆ ڕۆژی دواتر، وە منداڵێکی نەبوو بمرێت، وە ماڵێکی نەبوو بڕووخێت.

٤ - **زيد بن أسلم** ئەڵێت :

موسی علیه السلام پرسیاری لە پەروەردگاری کرد، فەرمووی : ئەی پەروەردگارم، کێن ئەوانەی ئەچنە شوێنە پیرۆزەکەتەوە - بەهەشت - ؟

فەرمووی - الله تعالی - : ئەی موسی، ئەوانەن کە دەستێکی پاک و دڵێکی بێخەوشیان هەیە، ئەگەر یادم کرا یادم ئەکەن، ئەگەر یادیان کردم یادیان ئەکەم، ئەوانەن کە لەبەر من یەکیان خۆشئەوێت و، مزگەوتەکانم ئاوەدان ئەکەنەوە و، لە کۆتایی شەودا داوای لێخۆشبوون ئەکەن، وە توورە ئەبن کاتێک حەرامەکانم حەلاڵ ئەکرێن وەک چۆن هەڵۆ توورە ئەبێت .

٥ - **سليمان بن سليم** ئەڵێت :

پرسیارکەرێک پرسیاری لە یعقوب علیه السلام کرد، وتی : لەبەر چی ئاوا لەشت تێکچووە و پێڵووی چاوت هاتووەتە خوارەوە بەسەر چاوتدا؟

فەرمووی : لەبەر درێژی تەمەن و زۆری دڵتەنگییەکان .

الله تبارک وتعالی وەحی بۆ کرد : ئەی یعقوب، لەلای بەندەکانم گلەییم لێ ئەکەیت؟!

یعقوب فەرمووی : ئەی پەروەدگارم، هەڵەیەک بوو کردم، گوناهێک بوو ئەنجامم دا، لێم خۆشبە.

٦ - **أبو یزید بن میسرة** ئەڵێت :

بە خاوەنی دەسەڵات ئەوترێت : ئەی دەسەڵاتدار، با دەسەڵاتدارێتی فووت تێ نەکات، لەبەر ئەوەی لە گڵ دروستکراویت، وە ئەبیتەوە بە گڵ، شوێنی کەسێکی پێش خۆتت بە میرات بۆ ماوەتەوە، وە خەڵکی تر دوای تۆ ئەم میراتیەیان بۆ ئەمێنێتەوە .

٧ - **یحیى بن جابر** ئەڵێت :

أبو الدرداء چووە سەر جەنازەیەک، تەماشای کرد کەسوکاری مردووەکە لەسەر مردووەکە ئەگرین. فەرمووی : داماوانە! مردووەکانی سبەینێ لەسەر مردووەی ئەمڕۆ ئەگرین .

٨ - **الحسن البصري** ئەڵێت :

ئەی نەوەی ئادەم سووک پێ بنێ بە زەویدا، چونکە دوای ماوەیەکی کورت گۆڕەکەتە، سوێند بە الله لەوکاتەوەی لە سکی دایکت کەوتویتەتە خوارەوە لە ڕووخاندنی تەمەنی خۆتدایت .

٩ - تابیعی بەڕێز **الحسن البصري** لە وەسفی سەلەفی خۆیدا کە هاوەڵانن ئەڵێت :

ئەگەر خراپەیەکیان ئەنجام بدایە خەمبار و دڵتەنگ ئەبوون پێی، وە داوایان لە الله ئەکرد لێیان خۆش ببێت، سوێند بە الله هیچ قەومێک لە ئەنجامدانی تاوان پارێزراو نین، وە ڕزگاریشیان نابێت تەنها بە لێخۆشبوون نەبێت .

١٠ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت :

الله تعالى فەرمانی بە بەندەیەکی کرد بۆناو ئاگر، کاتێک - بەندەکەی - لەسەر لێواری جەهەنەم وەستا و لای کردەوە و وتی : سوێند بە تۆ ئەی پەروەردگارم من گومانی باشم پێ ئەبردیت، الله عز وجل فەرمووی : (بیگەڕێننەوە، من لەجێی گومانباشی بەندەکەمم) فەرمووی : جا خرایە بەهەشتەوە .

١١ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت :

هیچ بەندەیەکی ئیماندار نییە کە لە چاوانی فرمێسک دێنە خوارەوە لە ترسی الله ئەگەر ئەوەندەی سەری مێش ـێکیش بێت ئیللا الله ڕووخساری لە ئاگر ئەپارێزێت .

١٢ - | أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ : ئایا ئەو کەسەی کە بە درێژایی شەو لە عیبادەتکردندایە و سوجدە ئەبات و شەونوێژ ئەکات و خۆی لە سزای دواڕۆژ ئەپارێزێت و ئومێدی بە ڕەحمەتی پەروەردگاری هەیە | (الزمر : ٩)

**الحسن البصري** لە تەفسیری ئایەتی : | أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ | ئەڵێت : لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی شەو .

١٣ - | فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ * لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ : ئەگەر بەڕاستی لە یادکارانی الله نەبووایە ئەوە لە سکی نەهەنگەکەدا ئەمایەوە هەتا ڕۆژی زیندووبوونەوە | (الصافات : ١٤٣ - ١٤٤)

**الحسن البصري** لە تەفسیری ئایەتی | فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ | : ئەگەر پێشتر کاری باشی نەکردایە ئەوە لە سکی - نەهەنگەکەدا - ئەمایەوە .

١٤ - | وَاسْأَلْهُمْ عَنِ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَتْ حَاضِرَةَ الْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِي السَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ | (الأعراف : ١٦٣)

**الحسن البصري** لە تەفسیری ئایەتی | كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ : بەو شێوەیە تاقیان ئەکەینەوە بەهۆی ئەو سەرپێچیانەی کردیان | ئەڵێت : بەهۆی ئەو تاوانانەی کە پێشتر ئەیانکرد .

: ئەم ئایەتە باسی هاوەڵانی ڕۆژی شەممە ئەکات کە الله تعالی فەرمانی پێ کردن لە ڕۆژی شەممەدا ڕاوەماسی نەکەن، جا ئەوانیش بە فێڵکردن لە ڕۆژی شەممەدا ڕاوەماسیان کرد و الله تعالی ـیش کردنی بە مەیمون و بەراز، جا الله تعالی تووشی ئەو تاقیکردنەوەیەی کردن بەهۆی ئەو تاوانانەی کە لە پێش تاقیکردنەوەکە کردوویانە وەک لە ئایەت و تەفسیرەکەیدا دیارە، واتە ئەگەر تووشی تاقیکردنەوەیەک یان شتێکی ناخۆش بوویت ئەوە هۆکارەکەی تاوانەکانی پێشووتری خۆتە، والله أعلم .

١٥ - **الحسن البصري** لە تەفسیری ئایەتی | يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا | (التحريم : ٨)

ئەڵێت : واز لە گوناهەکە ئەهێنێت و ناگەڕێتەوە سەری .

١٦ - **الحسن البصري** لە تەفسیری ئایەتی : | وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ | (الإسراء : ١٣)

ئەڵێت : کار و کردەوەکەی .

---

: ئایەتەکە باسی ڕۆژی قیامەت ئەکات، واتە لە ڕۆژی قیامەتدا کار و کردەوەی مرۆڤەکان وەکو تەوق و ملوانکە ئەکرێنە ملیان .

١٧ - | إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّاهٌ مُّنِيبٌ : بەڕاستی ئیبراهیم پیاوێکی لەسەرخۆ و خەمخۆر و تەوبەکارە | (هود : ٧٥)

**الحسن البصري** لە تەفسیری وشەی | أَوَّاهٌ |

ئەڵێت : بە بەزەیی و نەرم و نیان بەرامبەر بەندەکانی الله .

١٨ - باسی میوەکانی بەهەشت

| قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ | (الحاقة : ٢٣)

**الحسن البصري** لە تەفسیری ئایەتی | قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ |

ئەڵێت : لێی نزیک ئەبێتەوە تا وای لێدیت ئەیخوات لەو شوێنەوەی کە ئەیەوێت .

١٩ - **الحسن البصري** لە تەفسیری ئایەتی : | وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ : وە تا ئەو ڕۆژەی زیندوو ئەکرێنەوە بەرزەخیان لەپێشە | (المؤمنون : ١٠٠)

ئەڵێت : قەبرەکانیان - واتە بەرزەخی بە قەبر تەفسیر کردووە - .

٢٠ - **الحسن البصري** لە تەفسیری : | وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ : بەڕاستی زۆرێک لە جن و ئینسانمان بۆ جەهەننەم دروست کردووە | (الأعراف : ١٧٩)

ئەڵێت : | ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ | : واتە دروستمان کردووە بۆ جەهەننەم .

٢١ - کاتێک **سلمان** رضي الله عنه گەیشتە سەرەمەرگ پێی وترا : باوکی عبدالله بۆ ئەگریت؟ وتی : سوێند بە الله لەبەر ئەوە ناگریم لەسەرەمەرگدا بێئومێد بووبم، وە تەماحم لە دنیادا هەبێت، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەگریم رسول

الله ﷺ پێی فەرمووین : (هەر یەکێکتان لە دنیا هێندەی سواریەک توویشوی بەسە) .

٢٢ - **أبو الدرداء** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

ئەی نەوەی ئادەم، بەشێوەیەک کار بکە وەک ئەوەی - الله تعالی - ببینیت، وە خۆت لە مردووەکان حساب بکە، وە خۆت بپارێزە لە دوعای زوڵم لێکراو .

٢٣ - **أبو الدرداء** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

هەر کەسێک نیعمەتی الله لەسەر خۆی نەبینێت تەنها لە خواردن و خواردنەوەکەیدا نەبێت، ئەوە زانستی کەمە و سزاکەی ئامادەیە .

٢٤ - ئەتانەوێت الله تعالی ئێوەی خۆشبووێت؟

**الحسن البصري** ئەڵێت :

- هاوەڵان رضي الله عنهم - ئەیانوت : ئەی پێغەمبەری الله، ئێمە الله ـمان خۆشئەوێت، جا الله عز وجل ویستی نیشانەیەک دابنێت بۆ خۆشەویستی ئەوان بۆ الله، جا الله عز وجل ئەمەی دابەزاند : | قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ : بڵێ ئەگەر ئێوە الله ـتان خۆشئەوێت ئەوە شوێنم بکەون الله خۆشتانی ئەوێت، وە لە تاوانەکانتان خۆش ئەبێت، وە الله لێخۆشبووی بەبەزەییە | (آل عمران : ٣١)

٢٥ - **وهب بن منبه** ئەڵێت :

لە تایبەتمەندیەکانی دووڕوو ئەوەیە حەزی لە پیاهەڵدان و وەسفکردنە، وە ڕقی لە سەرزەنشتە .

٢٦ - | وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ : بەڕاستی سەختی مردن هات، ئەمە ئەوە بوو کە خۆتت لێ لائەدا و نەتئەویست تووشی ببیت | (ق : ١٩)

**الحسن البصري** لە تەفسیری ئایەتی | ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ |

ئەڵێت : خراپەکار لە دنیادا لەکاتی مردن خراپی بەسەر دێت .

٢٧ - **كردوس بن عمرو** ئەڵێت :

ئەبینین لەو کتێبانەی کە ئەیخوێنینەوە - واتە کتێبەکانی ئەهلی کیتاب - کە : الله تبارك وتعالى بەندە تاقی ئەکاتەوە لەکاتێکدا خۆشی ئەوێت بۆ ئەوەی پاڕانەوەی بەندەکە ببیستێت .

٢٨ - **بكر بن عبدالله المزني** ئەیگێڕایەوە :

ئافرەتێکی ئەهلی یەمەن کاتێک بەیانی ئەکردەوە ئەیوت : (ئەی نەفسەکەم، ئەمڕۆ ڕۆژی تۆیە و ڕۆژی ترت نییە) جا ئەو ڕۆژە هێندەی الله ویستی لێبێت کاری - باشەی - ئەکرد، کاتێک شەوی ئەکردەوە ئەیوت : (ئەی نەفسەکەم، ئەمشەو شەوی تۆیە و شەوی ترت نییە) جا ئەو شەوە هێندەی الله ویستی لێبێت کاری - باشەی - ئەکرد، جا ئەمە پیشەی بوو هەتا وەفاتی کرد .

٢٩ - **سفيان الثوري** ئەڵێت :

دوو دڵی و گومان لە دڵت دوور بخەرەوە، وە ئەو شتەشی کە ئەترسی لەوەی کە دڵت خراپ بکات .

٣٠ - **يحيى بن سعيد الأنصاري** ئەڵێت :

پێمگەیشتووە کە دەرگاکانی ئاسمان لە شەوی زاوایەتیدا ئەکرێتەوە بۆ پیاو، پێی ئەوترێت : (خۆپاکڕاگرتنت ویست لەوەی کە الله حەرامی کردووە) .

٣١ - | ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ النَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ : ئەوە ڕۆژێکە کە هەموو خەڵکی بۆ کۆئەکرێتەوە و هەموو ئامادەن و ئەیبینن | (هود : ١٠٣)

**إبن عباس** رضي الله عنهما فەرمووی :

| مَّشْهُودٌ | واتە : ڕۆژی قیامەت و | الْمَوْعُودِ | واتە : ڕۆژی قیامەت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : | ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ النَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ |

٣٢ - | وَخَشَعَتِ الْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا : دەنگەکان نزم بوونەوە لەبەر الرحمن، هیچت گوێ لێ نابێت جگە لە خشەخشێک نەبێت | (طه : ١٠٨)

**الحسن البصري** لە تەفسیری ئایەتی | فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا |

ئەڵێت : واتە خشە خشی پێیان .

---

: واتە لەو ڕۆژەدا ئەوەندە مەوقیفەکە قورسە کەس قسەی بۆ ناکرێت، تەنها گوێت لە خشە خشی پێی مرۆڤەکان ئەبێت .

٣٣ - **عمرو بن الأسود** ئەڵێت :

كاتێک رسول الله ﷺ ئەمەی ئەخوێندەوە | فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا : جا ئەو کاتە چۆن ئەبێت کە لە هەموو ئوممەتێک شایەتیدەرێکمان هێنا و تۆشمان - رسول الله ﷺ - هێنا وەکو شایەتیدەر لەسە ئەوان | (النساء : ٤١)

ئەگریا .

٣٤ - **حسن البصري** ئەڵێت :

پێمان گەیشتووە کە مەلائیکەکان خۆشحاڵ ئەبن بۆ ئیمانداران بە هاتنی زستان، شەوەکەی درێژە شەونوێژ ئەکات، وە ڕۆژەکەی کورتە ڕۆژوو ئەگرێت .

٣٥ - **مالک بن دینار** وتی :

من لە قورئانخوێنێکی خراپەکار زیاتر ئەترسم لە خراپەکارێک کە بەدیارکەوتووە بە خراپەکانی، لەبەر ئەوەی ئەمیان - قورئانخوێنەکە - دوورترە لەوەی کە ڕاستیەکەی دەربکەوێت .

٣٦ - **أيوب السختياني** ئەڵێت :

هیچ پیسێک پیستر نییە لە قورئانخوێنێکی خراپەکار .

٣٧ - **حزم** وتی :

چووینە لای مالک بن دینار لەو نەخۆشیەی کە تێیدا وەفاتی کرد، وە لەتاو ئازار ئەیناڵاند، سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و وتی : (ئەی پەروەدگارم خۆت ئەزانیت کە نەمویستووە لە دنیادا بمێنمەوە لەبەر سک و داوێنم) .

٣٨ - **مالك بن دينار** ئەڵێت :

ئێوە لە سەردەمێکی هێندە تاریکدان کە هیچ نابینرێت، وە ئێوەش لە تەماشاکەرێک زیاتر نین، ئێوە لە سەردەمێکدان زۆرن ئەوانەی کە فوویان تێ بووە، یان وتی : ئەوانەی کە سەرسامی خۆیانن، زمانیان لە دەمیاندا فووی تێ بووە و دنیا بەدەست ئەهێنن بە کردەوەی ئاخیرەت، ئاگاداریان بن نەتانخەنە ناو تۆڕەکانیانەوە .

ئەی زانا، تۆ زانایت و شانازی بە زانستەکەتەوە ئەکەیت! ئەی زانا تۆ زانایت و بەهۆی زانستەکەتەوە ئەخۆیت! ئەی زانا تۆ زانایت و گەورە و بەرز ئەبیتەوە بەهۆی زانستەکەتەوە! ئەی زانا تۆ زانایت و بەهۆی زانستەکەتەوە زیاتر و زیاتر کۆئەکەیتەوە! ئەگەر ئەو زانستەی کە ئێستا هەتە لەبەر الله فێری بوویتایە ئەوە لە خۆت و کار و کردەوەکانتدا دەرئەکەوت .

٣٩ - **عطاء بن السائب** وتی :

چووینە لای أبي عبدالرحمن السلمي نەخۆش بوو بۆ ئەوەی دڵی بدەینەوە .

أبی عبدالرحمن وتی : ئەو دڵدانەوەیەی ئێوەم ناوێت، چونکە من هەشتا ڕەمەزان بەڕۆژوو بووم .

٤٠ - **أبي مجلز** وتی :

بەندە هەمیشە لە تۆبەکردندایە هەتا ئەوکاتەی پشتگیری پاشا و دەسەڵاتدار نەکات .

٤١ - | إِنَّمَا التَّوْبَةُ عَلَى اللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السُّوءَ بِجَهَالَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُولَٰئِكَ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَيْهِمْۗ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا | (النساء : ١٧)

**الحسن البصري** له تەفسیری ئایەتی : | ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ : پاشان زوو تۆبە ئەكەن |

ئەڵێت : (هەتا ئەو كاتەی نەگەن بە غەرغەرەی مردن) .

٤٢ - **مقاتل بن حيان** له تەفسیری ئایەتی :

| سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ : نیشانەیەک له دەموچاویاندا دیارە بەهۆی شوێنەرواری سوجدە بردنەوە | (الفتح : ٢٩) .

ئەڵێت : (سپیەتیەک كە قیامەت لە دەموچاویاندایە) .

٤٣ - **ثابت البناني** ئەڵێت :

رسول الله ﷺ سەردانی نەخۆشێكی كرد، ڕووی لە نەخۆشەكە وەرگێڕا، كاتێک تەماشای ئەكرد نەخۆشەكە ڕەنگی ئەگۆڕا، وە كاتێک ڕووی لێ وەرئەگێڕا نەخۆشەكە ڕەنگی ئەگۆڕا، رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئایا لێم تێگەیشتن؟) وتیان : بەڵێ ئەی رسول الله .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەوەی - لەكاتی نەخۆشیدا - عارەق بكاتەوە ئیللا ئازاری هەیە، وە بەڕاستی كەسێک لەلای پەروەردگاریەوە هات بۆلای و مژدەی پێدا بەوەی كە - لە قیامەتدا - سزای لەسەر نییە) .

٤٤ - **غيلان بن جرير** ئەڵێت :

(كاتێک مسلم بن يسار نوێژی ئەكرد وەكو پارچە جلوبەرگێكی ڕاخراو وابوو، لەبەر كەمی جوڵەجوڵ كردنی) .

٤٥ - وترا بە پێغەمبەر ﷺ : ئیماندار هەیە بە قورسی ئەمرێت، وە كافر هەیە بە ئاسانی ئەمرێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (ئایا لەبارەی ئەوەوە پێتان بڵێم؟ ئیماندار تاوانی لەسەر ئەمێنێتەوە تا لەكاتی ڕۆحكێشانی پاک ئەبێتەوە، وە كافریش چاكەی ئەمێنێتەوە جا لەكاتی ڕۆح كێشاندا پاداشتی ئەدرێتەوە) .

٤٦ - **محمد بن كعب القرظي** لە تەفسیری ئایەتی : | اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْرًا : ئەی بنەماڵەی داود سوپاسگوزار بن | (سبأ : ١٣)

ئەڵێت : سوپاسگوزاری بریتیە لە تەقوای الله، كاركردن بە گوێڕایەڵی الله .

٤٧ - **إبن عباس** رضي الله عنهما لە تەفسیری ئایەتی : | يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا : ڕووكەشێک ئەزانن لە ژیانی دنیا | (الرُّومِ : ٧) .

ئەفەرمووێت : ( - ئەزانن - چ كاتێک كشتوكاڵ بكەن، وە كەی بچێنن و كەی بدورنەوە) .

٤٨ - **الحسن البصري** لە تەفسیری ئایەتی : | يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا . . . الآية : ڕووكەشێک ئەزانن لە ژیانی دنیا | (الرُّومِ : ٧) .

ئەڵێت : (زانستی كەسێكیان لە دنیادا ئەگاتە ئەوەی درهەمێک هەڵئەگێڕێتەوە لەسەر نینۆكی پێت ئەڵێت كێشی چەندە، كەچی بەجوانی نوێژ ناكات) .

٤٩ - **عبدالله بن عبدالرحمن** ئەڵێت :

دیاریەک هێنرا بۆ رسول الله ﷺ، جا داوای شتێکی کرد لەماڵەوە تا لە بریتی دیاریەکە بیدات بەڵام نەبوو، فەرمووی : (لەسەر زەویەکە دایبنێن، ئەگەر دنیا لەلای الله هێندەی باڵە مێشولەیەک قیمەتی هەبووایە ئەوە قومێک لە خواردنەوەی نەدەدا بە کافرەکان) .

٥٠ - **عبدالملک بن عمیر** ئەڵێت :

پیاوێک بە کوڕەکەی وت : (ئەگەر نوێژت کرد دەستنوێژ بە باشی بگرە، پاشان نوێژی ماڵئاوایی بکە، ئەگەر ئەتوانیت ئەمڕۆت لە دوێنێت باشتر بێت، وە سبەینێت لە ئەمڕۆت باشتر بێت ئەوە بیکە) .

٥١ - **الحسن البصري** ئەڵێت :

هەموو خێرێک لەم دوو ڕستەیەدایە : (دەستگرتن بەوەی فەرمانتان پێکراوە، وە نەهی کردن لەوەی کە نەهیتان لەبارەوە لێکراوە) .

٥٢ - **هشام بن حسن** ئەڵێت :

لەگەڵ الحسن البصري بووین، وەستا لەلای قەبرێک و وتی : (ئەی خەڵکینە، ژیانێک ئەمە کۆتاییەکەی بێت هیچ خێرێک لە سەرەتاکەیدا نییە) .

٥٣ - **عبدالرحیم بن سلیمان الرازي** ئەڵێت :

ئێمە لەلای سفیان الثوري بووین، ئەگەر کەسێک هاتبایە بۆ بۆلای فێربوونی زانست پێی ئەوت : (لە هیچ ڕێگەیەکەوە بژێوی پەیدا ئەکەیت؟) ئەگەر بیوتایە بەشی پێویستی هەیە ئەوە فەرمانی پێ ئەکرد بە فێربوونی

زانست، ئەگەر بیوتایە بەشی پێویستی نییە ئەوە فەرمانی پێ ئەکرد بە بەدەستهێنانی بژێوی .

٥٤ - **مالک بن دینار** ئەڵێت :

لە تەوراتدا نووسراوە (چۆن مامەڵە بکەیت بە هەمان شێوە مامەڵەت لەگەڵ ئەکرێت، وە چی بچێنیت هەر ئەوە ئەدووریتەوە) .

٥٥ - **یزید بن عبدالرحمن بن أبي مالک** ئەڵێت :

ڕێز لە سێ کەس ئەگیرێت : (پیرێک لە ئیسلامدا، دەسەڵاتدارێکی دادپەروەر، وە زانایەک لەگەڵ پیر یان گەنجدا بێت) .

٥٦ - | ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَتَ نُوحٍ وَامْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ : الله بۆ کافرەکان نموونەی بە خێزانی نوح و خێزانی لوط هێناوەتەوە، لەژێر دەسەڵاتی دوو بەندەی چاکەکارماندا بوون بەڵام خیانەتیان لێ کردن، پیاوەکانیان لە بەرامبەر الله نەیانتوانی سوودیان پێ بگەیەنن، پێیان وترا لەگەڵ ئەوانەی کە ئەچنە ناو جەهەننەمەوە ئێوەش بچن | (التحريم : ١٠) .

**الضحاک بن مزاحم** لە تەفسیری ئایەتی | فَخَانَتَاهُمَا : خیانەتیان لێ کردن | .

ئەڵێت : قسەیان ئەهێنا و ئەبرد، ئەگەر وەحیان بۆ بهاتایە بە موشریکەکانیان ڕائەگەیاند .

٥٧ - **حفصة بن زيد** وتی :

چوومە لای سالم، وە سالم مامم بوو، پرسیارم کرد دەربارەی ئەوەی ئافرەتان دایانهێناوە لە سەرجێیی کردن لەگەڵ یەکتر، وتی : (سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە لە ڕۆژی قیامەتدا وەکو دوو زیناکار ئەهێنرێن، یان وەکو دوو کەسی قەومی لوط، ئەو ئافرەتانەی کاری قەومی لوط ئەکەن هەمان حسابی پیاوانی قەومی لوط ـیان هەیە) .

٥٨ - **میمون بن مهران** ئەڵێت :

(واز لە دەمەدەمێ و موناقەشە بهێنە لەبەر کەمیی ئەو خێرەی تێیدایەتی) .

٥٩ - **ثابت البناني** ئەڵێت :

(کاتێک ئەڕۆشتینە لای أنس بن مالک ئەمانبینی داوای ڕۆنی بۆنخۆشی ئەکرد، جا ئەیدا لە دەستی و تەوقەی لەگەڵ هاوەڵانیدا ئەکرد) .

کەناڵ :

https://t.me/Hamam_alathari